# ناوەڕۆک

## یاسای یەکەم

### بەس پارە

مەنی مەنی مەنی ...

هەمیشە لە ژیاندا هەوڵ بۆ بەدەستهێنانی زۆرترین پارە بدە. وە هەرگیز وا مەزانە کە پارە هیچ نییە. وە ئەگەر وایش بیرت کردەوە ئەوە بزانە هەڵەیت.

هەمیشە لە ژیاندا بیر لە بەدەستهێنانی پارە بکەوە. چونکە بەبێ پارە ناگەیت بە هیچ. لەبەر ئەوە، ئەگەر دڵیشت لەسەر شتێک نەبوو ئەوە ناچاری بیکەیت چونکە پارەی تێدایە.

هەرگیز هیچ کارێک بۆ خزمەتکردن و چاکەکردن مەکە. بەڵام هەمیشە بۆ پارە بیکە. چونکە خزمەت و چاکەکردن هەرگیز گرینگ نییە و تەنها خۆت گرینگیت.

کەواتا: تەنها پارە.

## یاسای دووەم

## سیقە بە کەس مەکە

مـرۆڤ پێویسـتە هەمیشـە دوودڵ بێت لەگـەڵ ئەوانـەی دەیانناسێت. چونکە مرۆڤەکان بە گشتی خراپن. وە دڵنیا بە باشترینیشیان لە ژێرەوە خراپە و لەوانەشە خراپترینیان بێت ... کەواتا، پێویستە سیقە بە کەس نەکەیت.

هەمیشـە بـە چـاوێکی ڕەخنـەیی و دڵڕەقانـە ڕەچـاوی پەیوەندییەکانت بکە! ئەگەر بکرێت وا باشترە جاسووسـی و چاودێریش لەسەر هەموو ئەوانە دابنێیت کە دەیانناسیت. چونکە مرۆڤەکان بە گشتی خراپن. وە جێگـای متمانـە و سیقە نین.

## یاسای سێیەم

## کۆنترۆڵی زۆرترین کەس بکە

هەمیشە لە ژیانتدا هەوڵی کۆنترۆڵکردن بدە! بە تایبەتی هەوڵی کۆنترۆڵکردنی زۆرترین کەس بدە. لەم جەنگەڵەدا پێویستە تەنها تۆ لە سەرەوە بیت! نابێت کەس لە سەرەوە بێت جگە لە تۆ. ئەمەش بە کۆنترۆڵکردنی زۆرترین کەسەوە بەدەست دێت. کۆنترۆڵیان بکە و مەهێڵە ئازاد بن. بە تایبەتتر هەرگیز مەهێڵە سەربەخۆ بن. وایان لێ بکە تا ماون لە ژێر کۆنترۆڵی تۆدا بن.

هەرگیز ڕێگە مەدە کەس لە بن دەستت دەرچێت! وە هەر کەسێکیش لە ژێر کۆنترۆڵت دەرچوو تووشی توندترین سزای بکە و هەرگیز بەزەییت نەبێت.

## یاسای چوارەم

## بەزەیی تەنها بۆ لاوازەکانە

لەم جەنگەڵەدا نابێ بەزەییت هەبێ. وە هەرگیز بەزەیی بەرامبەریشت قبووڵ مەکە. قبووڵ مەکە هیچ کەسێک بەزەیی پێتدا بێتەوە. چونکە ئەگەر کەسێک بەزەیی بە تۆ هاتەوە واتا لای ئەو تۆ لاوازیت ...

-

هەرگیز بەزەییت بەرامبەر کەس نەبێت چونکە بەزەیی نیشانەی لاوازییە و ئەوانەی ڕەحمیان پێ دەکەیت دڵنیا بە بە گەمژە و نەزانت دادەنێن و هەمیشە وا بیر دەکەنەوە کە تۆ لاواز و کەمیت.

## یاسای پێنجەم

## تەنها خۆت

لەم جەنگەڵەدا دەبێت تەنها بۆ خۆت هەوڵ بدەیت. هەرگیزاوهەرگیز بیر لەوانی دیکە مەکەوە. چونکە لە ژیاندا تەنها خۆت گرینگیت. وە بیرت نەچێت هەرگیز هیچ کەرستە و شتومەکێک بە کەس مەبەخشە. لەم جەنگەڵەدا دەبێت تەنها خۆت بۆ خۆت بێت.

ژیان بریتی نییە لە کارکردنی بە کۆمەڵ و هاریکاریکردنی یەکتری! ژیان بریتییە لە ژیان بۆ خۆت. کەواتا هەرگیز مەهێڵە بەکارت بهێنن بۆ یارمەتیدانی خەڵکی دیکە. ئەوان دەیانەوێت بەکارت بهێنن ئاگادار بە.

## یاسای شەشەم:

## هەرگیز خێر مەکە

لەم جەنگەڵەدا پێداویستییەکان سنووردار و کەمن. لەبەر ئەوە نابێت هەرگیز پێداویستییەکانی خۆت بدەیت بە هیچ کەسێک.

خێرکردنیش لە پێداویستییەکانت کەم دەکاتەوە جا بۆیە ئاگادار بە و هەرگیز خێر بە هیچ کەسێک مەکە. لەم جەنگەڵەدا پێویستە لە ئاستێکی بەرزی چاوچنۆکیدا بیت.

لەم جەنگەڵەدا زۆرجار گیانلەبەرانی دیکە داوای خێر و یارمەتیت لێ دەکەن. بەڵام هەرگیز نابێت بە قسەیان بکەیت. چونکە پێداویستییەکان کەمن. وە بیر لە خۆت بکەوە! ئەی ئەگەر خواردنت بۆ نەمایەوە؟! ... دڵنیا بە ئەوانەی خێرت پێ کردن یارمەتیت نادەنەوە.

## یاسای حەوتەم:

## با لێت بترسن

لەم جەنگەڵەدا وا باشترە لێت بترسن لەوەی خۆشیان بوێیت. لە بیرت بێت، هەرگیز خۆت خۆشەویست و بە کەیف دەرمەخە. وە هەمیشە بە ڕوویەکی ترسناکەوە دەربکەوە. با لێت بترسن.

لەم جۆرە لێترسانەش بە جۆرەها شێوە بەرهەم دێت. دەتوانیت لە شوێنەکان خۆت تووڕە دەرخەیت و ئەگەر کەسێکیش هەڵەیەکی بەرامبەرت کرد بە توندترین شێوە سزای بدەیت تا ئەویش و ئەوانی دەورووبەریشی لێت بترسن.

## یاسای هەشتەم:

## هەرگیز خەندە مەکە

خەندەکردن بۆ مرۆڤی لاواز و کەمزانە! بۆیە هەرگیز خەندە مەکە. مەهێڵە خەڵک بزانن تۆ دڵخۆش و ژیاندۆستیت. ئەگەر ئەوان بزانن تۆ کەسێکی دڵخۆش و دەم بە خەندەیت لەوانەیە بە گێل و نەزانت بزانن.

گەر چوویتە هەر جێگایەک وا باشترە خەندە نەکەیت و وزەی ئەرێنی بڵاو نەکەیتەوە. چونکە ئەمە کاریگەری لەسەر کەسایەتی پیرۆز و زەبەندت درووست دەکات و دەبێت بە هەموو شێوەیەک کەسایەتیت بپارێزیت.

